

ژمارە

١٦



# گۆڤاری کۆمپیوتەر

( ئەیلول ) ی ٢٠٠٦

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت ـ وەزارەتی ڕۆشنبیری دەری دەکات






- بەرنامەی Super Cleaner بۆ خاوێن کردنەوەی کۆمپیوتەر لە فایلاتی زیاد

- تازەکاریەکانی وەرگێڕان و هەواڵ لە ماڵپەری گۆگڵدا

- قەبارەی پێنج گێگا بایت بۆ پۆستێکی ئەلکترۆنی

- دانانی شیفرە لە سەر تێکست بە بەرنامەی Aya

- کۆمپیوتەر لە بواری دارتاشیدا






هەولێر ـ ٢٠٠٦

پاشکۆی گۆڤار : سی دی تایبەت بە گۆڤارەکە




# گۆڤاری کۆمپیوتەر

ژمارە ١٦
ئەیلولی ٢٠٠٦

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت ـ وەزارەتی رۆشنبیری دەری دەکات


**تێبینی : هەموو پەیوەندیەکان لەڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت**


**ناونیشان :**
هەرێمی کوردستـــــــان/ عێراق ـ هەولێر . بەرامبەر دەرگای قەڵا باڵەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا
نهۆمی دووەم شوێنی مەڵبەندی کۆمپیوتەری ئاراس ی کۆن بۆ هەر پێشنیـــــــار و سەرنجێـــــک
یان ناردنی بابەتێـــــك . پەیوەندی بکـــــەن بەسەرنووسەرەوە بەم ناو نیشانە :
دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری ـ بەڕێوەبەرایەتی کۆمپیوتەر ـ یان ناونیشانی سەرەوە .
یان بە ژمارە تەلەفۆنی نووسینگەی گۆڤار : 2527054 یان مۆبایلی سەرنووسەر 07504618045

**یان پۆستي ئەلكترۆنی :**

E.mail: computer_magazine_2005@yahoo.com
aras_co_center@yahoo.com



**خاوەنی ئیمتیاز**
**وەزیری رۆشنبیری**

**سەرنووســـەر**
**ئاراز مەولود رەشید**

**بەڕێوەبەری نووسین**
**فاخر مەحمود میرزا**

**بەڕێوەبەری هونەری**
**سالم بابە شیخ**

**دەستەی نووسەران**
**رێناز ئەردەڵان بەکر**
**کاوە سلیمـــان**
**شاخەوان عمر حسن**

**سەرپەرشتی چاپ**
**ئەهرۆ مەحمود**




**تێبینی :**

بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە بابەت ئەنێرن بۆ گۆڤاری کۆمپیوتەر تکایە رەچاوی رێسای نووسین بکەن لەسەر کۆمپیوتەر بەدانانی خاڵبەندی نووسین بەم شێوەیەی لای خوارەوە

1. لـە پێش فاریـزە، هیــچ Spase نەبێت لە دوای فاریـزەش بـا یەك Spase هەبێت.
2. لە پێشخـــاڵ. هیچ Spase نەبێت لــە دوای خاڵیــش بــا دوو Spase هەبێــت.
3. ئەو بەڕێزانەی کە بابەتـــی وەرگێران ئەنێـــرن با ئاماژە بە سەرچـــاوەکەی بکـــەن.

# پێرست

# ئەو بەرنامانەی کە لە ناو سیدی ژمارە ١٦ دا هەیە

ئا : هێرش ئسماعیل

## بەشی ANTIVIRUSE






- Kasper sky Anti Virus Personal 5.0.383
- McAfee Virus Scan 2006 V10
- Pc Cillin 2005 12.0

## بەشی Burning





- Alcohol 120% v1.9.5 Build 3105
- BlindWrite.Suite.v4.3.1.WinALL.Incl.Keymaker-CORE
- CD R Win 5.05 + N NEW
- Dae Mon Tool 4
- Nero.Burning.Rom.7.0.1.4
- Speed.Gear.v3.01.Incl.Keygen-TSZ
- (Virtual Clone Drive (New
- Virtual.CD.v5.0.1.Network.Edition

## بەشی Audio & Video Tool






- Audio.Catalyst.v2.2.Retail
- Audio Grabber 1.81.2 Full Version
- Cool Edit Pro 2
- Cyber link Power DVD DELUXE v6.0.0.1102 Multilanguage
- Inter video Win DVD Platinum v7.0.B27.115
- Kara 3
- Real One Player Gold 3
- Real Player 10.5 Gold Final premium
- Winamp 5.50
- Windows Media Player 10
- Xing MPEG Player 3.3

## بەشی Game Tools




- Game Expert 6.0
- Game Master 7.0
- Game Wiz32 1.43 for Win XP
- VGS 1.41 FULL Latest for Final Fantasy 9
- artmoney714eng.exe

## بەشی Translator

- Chinese Star XP
- NJ Star Communicator 2.50
- Twin Bridge Chinese Patner 4.5

## بەشی Compressor Tools




- Win ZIP 10.0 Beta
- Win rar 3.5

## بەشی Cyber Cafe & Internet Tool





- CYBERCAFE PRO MANAGEMENT FULL RETAIL
- Internet Explorer
- MSN Messenger 7.5.0299
- Net scape Browser 8.0
- Net scape Communicator 4.79
- Yahoo! Messenger 6.0.0.1661

# بەرنامەی (SUPER CLEANER)

نا: عبدالرحمن علی
E-Mail: abdolrahman4689@yahoo.com

لای هەمووومان شتێكی ڕوون وئاشكرایە كە كۆمپیوتەر یەكێكە لە ئامێرە هەرە سەیرەكانی جیهان كە توانای ڕاپەڕاندنی كاروباری گشت بوارەكانی هەیە بەئاسانترین شێوە، جا لەئەنجامی بەجێ هێنانی ئەم كارانەدا وەك هەمووومان دەزانین لەناو كۆمپیوتەرەكەدا كۆمەڵێك فایلی زیادە وەكو پاشماوەیەك دروست دەبێت وئەمەش دەبێتە هۆی داگیركردنی قەبارەی هاردو كاردەكاتە سەر خێرایی ئامێرەكە، جا ئێمە ڕۆژانە پێویستە هەستین بە خاوێن كردنەوەی ئەم جۆرە فایلانە كە بۆ ئەم مەبەستە گەلێك بەرنامە هەن بەڵام تاكە بەرنامە كە لەم بوارەدا سەركەوتوو بێت بەرنامەی (SUPER CLEANER)ە كە خاوێن كەرەوەیەكی باڵایە لەم بوارەدا، جا بە پشتیوانی خودا هەوڵ دەدەم لایەنە گرنگەكانی ئەم بەرنامەیە بخەمە ڕوو:

سەرەتا دەبێت ئەم بەرنامەیە (SETUP) بكرێت لەناو ئامێرەكە ئینجا دەچینە سەر لیستی (START)وئینجا (PROGRAMS)ودەچینە سەر بەرنامەكەو دەیكەینەوە ئەگەر ڕاستەوخۆ نەبووەوە ئەوا لیستێك دەبێتەوە كلیك دەكەین لەسەر ( Continue Trial)بەرنامەكە دەبێتەوە وەك لە وێنە (١) دا دیارە.




وێنە (١)

ئینجا بۆ ئەوەی ئەو فایلانە دیاری بکەین کە دەمانەوێ بیان سڕینەوە سەرەتا دەچینە سەر (Unneeded Files) ئینجا لە خوارەوەی بەرنامەکە دەچینە سەر(Option) دەبینین لیستێك دەبێتەوە وەك لە وێنە(٢) دا دیارە



وێنە ( ٢ )

لەوێوە کلیك دەکەین لەسەر(Drives To Scan) دەبینین بەشە هاردەکانمان پێ نیشان دەدات وئێمەش هەموویان دیاری دەکەین بۆ ئەوەی فایلە زیادەکانی ناویان خاوێن بکرێنەوە پاشان هەر لەسەرەوە کلیك دەکەین لەسەر (General) وەك لەوێنەی(٣)دا دیارە



وێنە ( ٢ )

دەبينين ليستێك دەبێتەوە كە چەند زانيارييەكی تيايە كە ئەوانيش هەر تايبەتن بە خاوێن كردنەوەو ئێمەش هەموويان دياری دەكەين لە ڕێگەی چوار گۆشەی تەنيشتيانەوە، ئينجا هەر لەسەرەوە كليك دەكەين لەسەر((File Removal)) ليستێك دەبێتەوە كە دوو فرمانی تيايە ئەگەر بمانەوێ فايلە ڕەش كراوەكان بچنە ناو((Recycle Bin)) ئەوەی يەكەم دياری دەكەين((Move Delete Files To Recycle Bin)) بەڵام ئەگەر ڕاستەوخۆ ڕەش بكرێنەوە ئەوەی دووەم دياری دەكەين((Delete Files Permanently))، دوای ئەنجامدانی هەموو ئەم كارانە كليك لەسەر((Ok)) دەكەين، پاشان هەردوو ووشەی((Start Menu)) لەگەڵ((Internet Favorits)) دەبينرێن كە ئەگەر كليك لەسەر هەر كامەيان بكەين ليستێك دەبێتەوەكە پێكهاتووە لە (General) و((File Removal)) كە هی يەكەم دەكەينەوە گشت بۆشاييەكان دياری دەكەين وهی دووەميش پێت دەڵێت ئايا فايلەكان بچنە ((Recycle Bin)) يان نا، ئەمەی باسمان كرد تەنها ڕێكخستنی بەرنامەكە بوو ئيتر لە دوای ئەمە پێويست ناكات ئەم هەنگاوانە دووبارە بكەيتەوە، ئينجا بۆ دەست پێ كردنی خاوێن كردنەوەكە دەچينەوە سەر((Unneeded Files)) و يەكسەر لە خوارەوە كليك لەسەر ((Scan)) دەكەين و چاوەڕوان دەكەين بەرنامەكە خۆی هەڵدەستێ بە دۆزينەوەی فايلە زيادەكان، كە تەواو بوو كليك دەكەين لەسەر((Select All)) ئينجا((Delete)) دەبينين ڕاستەوخۆ فايلەكان دەسڕێتەو

## ئاگاداری

بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی كە توانای نووسينيان هەيە لە بواری كۆمپيوتەر وئەنتەرنێت ئەگەر توانای نووسينی بابەتيان هەيە لەم بوارەد دەتوانن بەشداری بكەن لە گۆڤاری كۆمپيوتەر ودەتوانن سەردا نمان بكەن يان بابەتەكانيان بنێرن بۆ ئەم ناونيشانە :

هەرێمی كوردستانی عيراق / يەكەی كۆمپيوتەر لە ديوانی وەزارەتی رۆشنبيری جادەی شەست مەتری نزيك هۆڵی زەرد ، يان پەيوەندی بكەن بە سەرنووسەرەوە بەم ناونيشانە : مەڵبەندی كۆمپيوتەری ئاراس ، هەولێر بەرامبەر قەڵا ، باڵەخانەی قەيسەری حاجی يەحيا نهۆمی دووەم يان بە ژمارە تەلەفۆنی: ( ٢٢٣٢٧٢١ ) مۆبايل: ( ٠٧٥٠٤٦١٨٠٤٥ ) يان پۆستی ئەلكترۆنی

**E-MAIL: COMPUTER_MAGAZINE_2005@YAHOO.COM**
**E-MAIL: ARAS_CO_CENTER@YAHOO.COM**

### تێبينی:

- هەر بابەتێك بڵاو بكرێتەوە پاداشنی پێ دەدرێت.
- هەر بابەتێك لە شوێنێك يان ڤۆڤارێكی تری كوردی بڵاو بكرێتەوە ئێمە بڵاوی ناكەينەوە.
- بابەتەكانتان ئەگەر ئەشيا بۆ بڵاو كردنەوە ئەوا ناگەڕێتەوە.
- هەر كەسێك بابەت ئەنێری بۆ بڵاو كردنەوە با باەتەكەی لەسەر فلۆپی ديسك يان فلاش ميموری بێت ووێنەی روونكەرەوەكـان بە جيـا لە نێو فۆڵدەرێك دا دابێت وبابەتەكەی بە بەرنامەی MICROSOFT WORD بنووسێت.

# چۆنیەتی دروستکردنی یاری ئاگری لەبەرنامەی میدیا ستۆدیۆ

ئا: فاخر مەحمود

بەرێزان وەك لەپێشوشدا باسمان لەگرنگیەکانی بەرنامەی میدیا ستۆدیۆکردبوو کە چەند کارێکی گرنگ ئەنجام دەدات لەبواری ڤیدیۆ و مۆنتاج کە بەراستی ئەوکارانەی ئەم بەرنامەیە دەیکات لەتوانای هەموو بەرنامەیەکی مۆنتاج دانیە و هەروەها هیچ بەرنامەیەکی مۆنتاج تاکو ئێستا وەك بەرنامەی میدیا ستۆدیۆ کارکردنی ئاسان نیە هەروەها رینـدەری هیچ بەرنامەیـەك وەك ریندەری بەرنامـەی میـدیا ستـۆدیۆ خێرا نیـە لەبەرئـەوەی ئێـستا لـەبازارەکان و هـەروەها لـە کۆمپانیاکان و لە تەلەفزیۆنەکان زۆربەیان کارلەسەر بەرنامەی میدیاستۆدیۆ دەکەن هەروەها دانانی جوڵەکان کەلە زنجیرەکانی پێشوودا باسمان لێوە کردبوو زۆربەی بەرنامەکان دەچنە ناو بەرنامەی میدیاستۆدیۆ جوڵەکانیان لەوێوە زیاد دەبێت هەروەها چەندین شتی جوانتر دروست دەکرێن بەبەرنامەی میدیاستۆدیۆ لەوانە یاری ئاگری کە شێوەکەی زۆر جوانە وهـەروەها زۆریـش لەڕاستی دەچێت باشە ئەوشتە چۆن دروست دەکرێـت ؟ سـەرەتا دێین بەرنامـەی میدیاستۆدیۆ دەکەینەوە پاشان لەخوارەوە لەسەر هێڵەکان بەلای ڕاست کلیك دەکەین ئینجا لیستێك دەبێتەوە یەکەم نوسین هەڵدەبژێرین کە video file ە وێنە ١




وێنە (١)

پاشان لیستێك دەبێتەوە کەلیستی هاردەکانە ئینجا ئەوپارچە ڤیدیۆیەی کەلەناو هاردەکەت هەڵتگرتوە دووجار کلیکی لەسەردەکەیت پاشان راستەوخۆ دێتە ناو بەرنامەی میدیاستۆدیۆ وێنە٢



وێنە (٢)

دواتر لەناوبەرنامەکە بەلای راست کلیکێك لەسەر پارچە ڤیدیۆکە دەکەیت لیستێك دەبێتەوە لەم لیستەدا video filters هەڵدەبژێرین وێنە ٣



وێنە (٣)

پاشان لیستێك دەبێتەوە لەم لیستەدا لەلای چەپ دەگەڕێین بەدوای نوسراوێك کە بەناوی Fire Workە ئینجا Add کلیك دەکەین وێنە ٤




ئێستا ئەگەر بێت و بەرنامەکە کارەکانی پلەی بکەین دەبینین بەشێوەی یاری ئاگری شتێك بەرز دەبێتەوە پاشان بەسەرهەموولایەك دادێتەخوارەوە وێنە ٥



# بەرنامەی Adobe Premier

زنجیره( ١٠ )

فەیسەل مەعروف گەردی

بەرنامەی Adobe Premier چەندین کاریگەری تێدایە کە دەتوانرێ زیاد بکرێنە سەر بابەتە ڤیدیۆییەکان ، لەم زنجیرەیەدا هەوڵدەدەین کاریگەریەکی ڤیدیۆیی Video Filter زیاد بکەینە سەر دیمەنی چوارەم Finale .avi ، کاریگەریەکەش Camera Blur ە :

١. کاریگەریەکە هەڵدەبژێرین ، ڕای دەکێشین و دایدەبەزێنینە سەر دیمەنی چوارەم Finale .avi. (وێنەی١).




وێنەی ( ١ )

٢. بەشێوەیەکی خۆکار(ئۆتۆ) تابلۆی تایبەت بە دەستکاری کاریگەریەکانEffect Controls دەکرێتەوە ، گەر ئەم تابلۆیە دەرنەکەوت دەچینە سەر لیستی Window و فەرمانیShow Effect Controlsهەڵدەبژێرین. (وێنەی٢).




وێنەی ( ٢ )

٣. پاش دەرکەوتنی تابلۆیEffect Controls ، نیشانەی سێگۆشەکـــــە دەجولێنـــــین کە تایبەتە بە جـــێ بەجێکردنی کاریگەریەکە .(وێنەی٣).



وێنەی ( ٣ )

٤. چاودێری ئەنجامەکە دەکەین لە پەنجەرەی بینینProgram . (وێنەی٤).



وێنەی ( ٤ )

٥. ئێستا هەڵدەستین بە دەستکاری کردن لە جێ بەجێ کردنی کاریگەریەکە بەشێوەیەك کاتێ دەگاتە ناوەڕاستی دیمەنەکە لەگەڵ تێپەڕبوونی کات بەهای بەرز دەبێتەوە ، سەرەتا هێڵی دەستکاری دەگێڕینەوە سەرەتای دیمەنەکە ، پاشان لە تابلۆی Effect Controls کلیلی جوولە Framing Enable Key کارا دەکەین ،بەهای کاریگەریەکە ڕێك دەخەین و دەیکەینە (سفر).(وێنەی٥).



وێنەی ( ٥ )

٦. هێڵی دەستکاری Edit Line دەجوڵێنین بۆ ناوەڕاستی دیمەنەکە، نیشانەی بەهاکە دەبەینە سەر (سفر) ، بەم شێوەیە کاریگەریەکە کارناکات تا دەگاتە ئەم کلیلە. (وێنەی٦).




وێنەی ( ٦ )

٧. هێڵی دەستکاری دەگوازینەوە بۆ کۆتایی دیمەنەکە ، بەهــای کاریگــەری Camera Blur بەرز دەکەینەوە بــۆ (٨٥٪) . (وێنەی٧).




وێنەی ( ٧ )

٨. دەتوانین ئەو کلیلانەی دروستمان کردوون بیانبینین ئەویش بە فراوان کردنی چینەکە ، وە بۆ هەموار کردنی بەهای هەر کلیلێك، کلیلەکە دیاری دەکەین و پاشان بەهاکەی دەگۆڕین . (وێنەی٨).




وێنەی ( ٨ )

١. دیمەنەی چوارەم هەڵدەبژێرین.

٢. لەتابلۆی تایبەت بە کاریگەریەکان Effect Controlsو لەبەشی جوونە Motion و دوگمەی Setupکلیك دەکەین .(وێنەی٩).




وێنەی ( ٩ )

٣. یەکسەر پەنجەرەیەکی نوێمان بۆدەکرێتەوە کە تایبەتە بە ئامادەکاریەکانی جووڵەی پەنجەرە Motion Settings .

٤. بۆ بینینی ئەنجامی کارەکەمان هەڵدەستین بەداگرتنی دوگمەی Play . (وێنەی١٠).




وێنەی ( ١٠ )

# چۆن تراکێك کۆنڤێرت دەکەیت لەبەرنامەی
# Cool Edit Pro

ئا: کاوە سلێمان

بەرنامەی کول ئیدت پرۆ چەند کارێکی زۆرگرنگ ئەنجام دەدات وەك لە زنجیرەکانی پێشوودا باسمان لێوەکردبوو کەگرنگیەکی ئەوتۆی هەیە لەبواری دەنگ بەڵێ بەراستی ئەو کارە رێك وپێکانەی لەوبەرنامەیە ئەنجام دەدرێت زۆر شتێکی قورسە لەلایەن بەرنامەکانی ترەوە بەلأم کول ئیدت دەیان کاری زۆر قورسی بۆئاسان کردوین ئەگەر بێت و لێی وورد بینەوە هەست بەگرنگیەکانی ئەوبەرنامەیە دەکەین کرداری کۆنڤێرت بەزۆربەی بەرنامەکانی تر ئەنجامدەدرێت بەلأم ئێمە لێرەدا ئەگەرهاتو هەر کارێك بکەین بەرنامەیەکی بۆداببەزێنین ئەوکاتە کۆمپیوتەرەکانمان زۆر قورس دەبن و کەڵکی کارکردنیان نامێنێت بۆیە دەبێت پشت بەوە ببەستین کەبەرنامەیەك چەند کارێکمان بۆئەنجام بدات، بەڕێزان ئێستا باس لەکۆنڤێرت کردنی تراکێك دەکەین بە بەرنامەی کوول ئیدت واتا تۆ تراکێکی mp3 ت هەیە دەتەوێ بیگۆریت بۆ wave چۆن ئەوکارە ئەنجام دەدرێت سەرەتا دێین بەرنامەکە دەکەینەوە پاشان لەسەرەوەی بەرنامەکە fileلێدەدەین پاشان batch file convertهەڵدەبژێریت وێنە ١




وێنە ( ١ )

ئینجا لیستێك دەبێتەوە لەلای سەرەوەی لیستەکە Add نوسراوە بەماوس کلیکێکی لەسەردەکەیت راستەوخۆ لیستی هاردەکان دەبێتەوە تۆ ئەو تراکەی پێویستە دووجار کلیکی لە سەردەکەیت راستەوخۆ دێتە ناولیستەکە وێنە ٢



وێنە (٢)

پاشان لەخوارەوەی لیستەکە new format هەیە ئینجا ژمارە سێی لێنوسراوە یەك کلیکی لەسەر دەکەیت لیستێك دەبێتەوە لەسەرەوەی ئەم لیستە windos pcm (wave) نوسراوە یەك کلیکی لەسەردەکەیت و پاشان چەند شتێکی لێزیاد دەبێت تۆ بەدڵی خۆت کام فایلت بوێت هەڵی دەبژێریت دەنگەکە بەم فایلە خەزن دەبێت وێنە ٣



وێنە (٣)

پاشان run batch لێدەدەیت چاوەڕێ دەکـــەیت تا تەواو دەبێت دەنگە کۆنڤێرتکراوەکە دەچێتـــە مایدۆ کۆمێنت وێنە ٤




وێنە ( ٤ )

# بەرنـــــــامەی
# Screen Movie Studio

ئا: شادمان قاسم

لەرێگای ئەم بەرنامەیە دەتوانی هەموو ئەوکارانەی ئەنجامی دەدەیت لەسەر شاشە دووبارە بیان بینیتەوە ئەم بەرنامەیە زۆر بەسودە بەتایبەتی بۆئەوانەی بەرنامە شەرح دەکەن بەوێنەوە واتا تۆدەتەوێ کارێك بکەیت لەسەرکۆمپیوتەر بەلآم وێنەی ئەم کارانەی دەیان کەیت بگیرێت لەم کاتەدا ئەم بەرنامەیە ئاسانکاریت بۆدەکات و هەمووشتەکان بۆ ریکۆرد دەکات زۆر بەجوانی ئەم کارەش زۆر پێویستە بەراستی زۆرجاران ئێمە پێویستیمان بەشتێکی وادەبێت کە ئەوشتانەی دەیکەین بە وێنەوە لامان بمێنیتەوە بەرێزان کارپێکردنی ئەم بەرنامەیە زۆر ئاسانە سەرەتا پاش دابەزاندنی بەرنامەکە لەسەر ئامێری کۆمپوتەر دێین بەرنامەکە دەکەینەوە پاشان لەسەرەوەی بەرنامەکە لەلای چەپ هێمایەکی سوورهەیە کەهێمای ریکۆردە بەماوس کلیکێکی لەسەردەکەین هەرلەگەلْ کلیکەکە دوو هێلی گەورە پڕ بە شاشە دروست دەبێت وەکو هێمای کۆ وایە وێنە١




وێنە (١)

پاشان لەکوێوە تاکوێت دەوێت ریکۆردبێت جارێك بەماوس کلیك بکە بەڵام دەستت هەڵمەگرە تا ئەو شوێنەی دەتەوێت پاشان دەستت هەڵگرە لەسەرماوسەکە ڕاستەوخۆ هێڵێك دروست دەبێت کەرەنگەکەی جارێك سووردەبێت و جارێکیش ڕەش دەبێت وێنە٢



وێنە (٢)

تائەوکاتەی خۆت ستۆپ کلیك دەکەیت یەکسەر لیستێك دێت بەم شێوەیە وێنە ٣ پێت دەڵێت ئەم پارچە ڤیدیۆیە لەکوێ خەزن دەکەیت تۆش ناوێکی بۆدادەنێیت و پاشان لەهاردێك خەزن دەبێت.



وێنە (٣)

# ( NORTON GHOST )
# چۆنیەتی کارکردنی لە ڕێگای (دۆس)

## زنجیرەی یەکەم

ئا: ئیسماعیل خەلیل

لە ژمارەکانی پێشوو باس لە چونیەتی کارکردنی بەرنامەی ( Norton Ghost ) مانْ کرد لە ڕێگای ویندۆزەوە و باس لە چونیەتی دروستکردن و گەڕاندنەوەی وینەی یەدەکمان کرد لە هەمان ڕێگادا، و لەم زنجیرەیەدا پەنا بەخوای گەورە باس لە چونیەتی کارکردنی بەرنامەی نورتۆن گۆست لە ڕێگای ( دۆس ) ئەکەین، و باس لە چونیەتی دروست کردنی وینەی یەدەك بۆ سیستەم یان بۆ بەشێك لە هاردیسك ئەکەین، یان لە هاردێسکێك بۆ هاردیسکێکی تر ئەگەر دوو هاردیسکمان هەبوو و هەر لە ڕێگای دۆسەوە، بەلام شتێکی گرنگ هەیە لێرە ئەمەوی ئاماژەی پێ بکەم ئەویش ئەوەیە کەوا شارەزایی لە کارکردنی ئەم بەرنامەیە لە بواری دۆس زۆر پێویستە لەبەر ئەوەی ئەگەر هاتوو ویندۆزەکەمان تێکچوو ئێمە ناتوانین وێنەی یەدەکەکەمان کە لە پێشوو لە ویندوز دروست مان کردبوو بگەڕینیەوە، بۆیە زۆر پێویستە شارەزایی کارکردن لەسەر ئەم بەرنامەیە لە بواری دۆس، بۆ زانین ئەتوانین کار لە سەر ئەم بەرنامەیە بکەین بەبێ ئەوەی ویندۆزەکەمان تێکچووبێ، و ئەتوانین وینەی یەدەك بۆ سیستەم یان بۆ هەر بەشێکی تری هاردیسك دروست بکەین .

پێشەکی ئەبێ سی دی ( CD ) بەرنامەی نورتۆن گۆست Norton Ghost مان هەبێت کە لە ڕێگای دۆس کار بکات، لەسەرەتا بەرنامە پێوستەکانمان دائەبزێنین و هاردەکەمان لە فایلە زیادەکانی کاتی و فایلە زیادەکانی ئەنترنێت خاوێن ئەکەین تاوەکو قەبارەی وینەی یەدەکەکەمان بچووك بێت، پاشان (سی دی) بەرنامەکە ئەخەینە ناو کۆمپیوتەرەوە و پاشان کۆمپێوتەرەکە ڕیستارت ئەکەین، لەپاش ڕیستارت بوونی کۆمپیوتەرەکە چوارگۆشەکمان بۆ دەرئەکەوێت، لەناو چوارگۆشەکە کلیك بکە لە سەر فەرمانی ( OK ) بڕوانە وێنەی ژمارە (١)




وێنە (١)



پاشان بچوو بۆ سەر لیستی بەرنامەکان و کلیکی لەسەر بکە و بچوو بۆ سەر فەرمانی ( Local )، لەپاشان لیستێکمان بۆ دەرئەکەوێت کە بریتیە لە سێ هەلبژاردە ئێمە هەلبژاردەی دووەم کە نوسراوە ( Partition) هەڵدەبژێرین و کلیکی لەسەر ئەکەین، لەپاشان لیستێکی تر دەرئەکەوێت ئەویش سێ هەڵبژاردەیە، ئیمە هەلبژاردەی دووەم کەنوسراوە ( To Imag ) هەڵدەبژێرین و کلیکی لەسەر ئەکەین بڕوانە وێنەی ژمارە ( ٢ )



وێنە ( ٢ )

ولە وێنەی ژمارە ( ٣ ) هاردیسکەکە هەلبژێرە و کلیك بکە لەسەر ( OK ) ئەگەر یەك هاردێسکت هەبێ، بەلآم ئەگەر دوو هاردیسکت هەبێ لەوکاتە هاردیسکی مەبەست هەڵدەبژێرین کە وێنەی یەدەکی بۆ ئەکەین ، لێردا ئیمە داماناوە کەوا یەك هاردێسکمان هەیە



وێنە ( ٣ )



پاشان چوار گۆشەیەك دێت بەشەکانی هاردیسك دیاری دەکات، ئیمە بەشی ( C ) لە هاردەکە هەڵدەبژێرین چونکە سیستەمی تیدایە و کلیکی لەسەر ئەکەین بروانە وێنەی ( ٤ )

Select source partition(s) from Basic drive: 1

| Part | Type | ID | Description | Volume Label | Size in Mb | Data Size in Mb |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | Primary | 06 | Fat16 | No name | 2047 | 1297 |
| 2 | Logical | 06 | Fat16 extd | No name | 1976 | 437 |
| | | | | Free | 3 | |
| | | | | Total | 4028 | 1734 |

OK　　Cancel

وێنە ( ٤ )

پاشان چوار گۆشەیەکی تر دێت کە داوات لێ ئەکات کەوا وێنەی یەدەکەکە لە بەشێك لەبەشەکانی تری هاردەکە دابنی کە لە خانەی ( Look in ) ئەبی بەشەکە دیاری بکەیت بۆ نمونە بەشی ( D ) لە هاردەکە دیاری ئەکەین یان هەربەشێکی تری هاردەکە تەنها ئەو بەشە نەبێت کەوا وێنەی یەدەکەمان بۆ کردووە، بۆ نمونە ئیمە وێنەی یەدەك بۆ بەشێ ( C ) ئەکەین ناکرێت وێنەی یەدەکەکە لەهەمان بەشدا دابنیی، پاشان و هەر لە خواروی چوارگۆشەکە و لە خانەی ( File name ) ناوێك بۆ وێنەی یەدەکەکە دابنیّ، پاشان کلیك بکە سەر فەرمانی ( Save ) بروانە وێنەی ژمارە ( ٥ )

File name to copy image to

Look in:

| Name | Size | Date |
|---|---|---|
| .. | | 30/07/2001 02:23:18PM |

File name:　　Save

Files of type: *.GHO　　Cancel

Image file description:

وێنە ( ٥ )



پاشان چوار گۆشەیەکی تر دێت سێ هەڵبژاردەی تێدایە کەوا داوات لێ ئەکات کەوا ئاستی پەستان (مستوى الضغط) دیاری بکەیت ، مانای ئەوەیە کەوا ئەگەر ویستت وینەی یەدەکەکەت هەر وەك ئاستی خوی بێت هیچ گورانکاری لیی نەکرێت ئەوا هەلبژاردەی ( No ) هەڵبژێرە، و ئەگەر ویستت پەستانێکی سادە بێت فەرمانی ( Fast ) هەڵبـژێرە، و ئەگەر ویستت پەستانیکی بەهێزبێت کەوا قەبارەی وینەی یەدەکەکەت بچوك بکات ئەوا فەرمانی ( High ) هەڵبـژێرە، ئیمە فەرمانی ( Fast ) هەڵدەبژێرین و کلیکی لە سەر ئەکەین بڕوانە وێنەی ژمارە ( ٦ )



وێنە ( ٦ )

پاشان چوار گۆشەیەکی تر دێت کەوا دوو هەلبژاردەیە کلیك بکە سەر فەرمانی ( Yes ) بڕوانە وینەی ژمارە ( ٧ )



وێنە ( ٧ )

و لـە کۆتـایی نورتـون گۆسـت دەست بە کرداری کۆپـی کردنی فایلەکـــانی وێنـــەی یەدەکەکە ئەکـات و کردارەکـــە نێزیکـی ( ١٠ تـا ١٥ ) خولـەك ئەخاینـی بڕوانە وێنەی ژمارە ( ٨ )



وێنە ( ٨ )

و لە پاش تەواو بوونی کردارەکە هەندیك جار چوار گۆشەیەك دێت کەئەڵی کردارەکە تەواو بوو، لە چوارگۆشەکە کلیك بکە لەسەر فەرمانی ( Continue ) بڕوانە وینەی ژمارە ( ٩ )



وێنە ( ٩ )

پاشان کۆمپیوتەرەکە لە خۆیەوە ڕیستارت ئەبێ، و لە پاش ڕیستارت بوونی کۆمپیوتەر ئەبینی وێنەیەکی یەدەکت بۆ دروست بووە، و هەرکاتێك سیستەمەکەت تێکچوو ئەوە بە چەند هەنگاوێك ئەتوانی سیستەمەکەت بیگەرینێتەوە کەوا لە ژمارەی داهاتوو باس لە چۆنیەتی گەڕاندنەوەی ئەکەم .

## ئاگاداری

داوا لە هەموو ئەو خوێنەرە بەرێزانە دەکەین کە هەر پێشنیارێك یان هەر تێبینیێك یان هەر رەخنەییکیان هەبوو یان هەر کەم وکورپییکیان لە گۆڤارەکە بە دی کرد با ئاگادارمان بکاتەوە بەم ناونیشانە :

هەرێمی کوردستانی عێراق / یەکەی کۆمپیوتەر لە دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری لە هەولێر شەقامی شەست مەتری نزیك هۆڵی زەرد.
ژمارە تەلەفۆنی : ( ٢٢٣٢٧٢١ ) / مۆبایل : ( ٠٧٥٠٤٦١٨٠٤٥ )
یان پۆستی ئەلکترۆنی :

E-MAIL: COMPUTER_MAGAZINE_2005@YAHOO.COM
E-MAIL: ARAS_CO_CENTER@YAHOO.COM
E-MAIL: ARAS_AAA@HOTMAIL.COM

# بەرنامەی AutoCAD

## زنجیرەی ٨

ئا: غزالە یونس

سەرەتا بەڕێزانم ئەم زنجیرەیەی ئەمڕۆ تەواو کەری زنجیرەکانی ترە بەڵام لە زنجیرەی ئەمڕۆماندا دەچینە سە ر لیستێکی نوێ ئەمیش لیستی ڕێکخستنە (Modify) وێنەی ١. لەم لیستەدا ئەو ئایکۆنانەی تێدایە بە هۆیانەوە دەتوانین دەست کاری ئەو وێنانە بکەین کە پێویستیان بە دەست کاری کردنە .جا لێرەدا ئێمە یەکە یەکەی ئایکۆنەکان باس دەکەین .

١- Eaerse(المساحە) یەدەکی سڕینەوە.

ئەم ئایکۆنە لەلیستی ڕێکخستنە دەتوانین بانگی بکەین لەچەند شوێنێك یەکێك وەك:-

١-لەلیستی Modify دەچینە سەر Eaerse وکلیکی لەسەر دەکەین (وێنەی ١).



وێنە (١)

٢-لە شریتی کەرستەکان کلیك لەسەر Eaerse دەکەین .

بەڕێزانم بۆ بەکارهێنانی ئەم فەرمانە سەرەتا بۆ نموونە وێنەیەك دروست بکە ئەگەر ویستمان بیسڕینەوە ئەوا بانگی فرمانە کە دەکەین پاشان کلیك لەسەر وێنەکە دەکەین پاشان Enter دەکەین ئەوا وێنە کە دەسڕیتەوە .

٢- Copy لەبەرگرتنەوە . ئەم ئایکۆنەش هەر وەك فرمانی پێشوو وایە لەلیستی ڕێکخستنە دەتوانین بانگی بکەین لە چەند شوێنێك یەکێك وەك:-

١-لەلیستی Modify دەچینە سەر Copy وکلیکی لەسەر دەکەین (وێنەی ٢).

٢-لە شریتی کەرستەکان کلیك لەسەر Copy دەکەین .

بەڕێزانم بۆ بەکارهێنانی ئەم فرمانە سەرە تا هەر وێنەیەك کە دروستمان کرد بێت .



وێنە ( ٢ )

ئەگەر ویستمان لەبەری بگرینەوە بەچەند دانەیەکی تر ئەوا بانگی فرمانەکە دەکەین پاشان کلیك لەسەر وێنەکە دەکەین ئینجا Enter پاشان خالێك دەست نیشان دەکەین لەسەر وێنەکە لەوێوە ڕایدەکێشین (وێنەی ٣) لە شوێنی مەبەست دایدەنێن دەبێت بە دوو وێنە (وێنەی ٤).



وێنە ( ٢ )




وێنە ( ٤ )

٣- Move جولەدان بە وێنەکان.

ئەم ئایکۆنەش هەروەك فەرمانەکانی پێشوو وایە لەلیستی رێکخستنە دەتوانین بانگی بکەین کاریشی جوڵەدانە بەو وێنەی کە دەمانەوێت لە شوێنێك بیبەین بۆ شوێنێکی تر لە چەند شوێنێکیش هەیە.

١-لەلیستی Modify دەچینە سەر Move کلیکی لەسەر دەکەین (وێنەی ١).

٢-لە شریتی کەرستەکان کلیك لەسەر Move دەکەین .

ئەمەش پاش وێنەکردن بانگی فەرمانەکە دەکەین ئینجا کلیك لەسەر وێنەکە دەکەین پاشان Enter ئینجا کلیك لەسەر هەر خاڵێکی سەر وێنەکە دەکەین و دەیگوازینەوە بۆ ئەو شوێنەی کە دەمانەوێت.

٤- Scale گەورە کردن وبچووك کردنی بەشەکان.

ئەم ئایکۆنەش بەکاردەهێنرێت بۆ گەورەکردن و بچوك کردنی وێنەکان بەرێژەیەکی دیاریکراو ئەمیش دەکەوێتە لیستی Modify (وێنەی ١).

٥. Mirror ئەم فەرمانەش لە لیستی Modify (وێنە ١ ) وەك ئاوێنەیەك كاری لە سەر دەكرێت سەرەتا بانگی فەرمانەكە دەكەین ( وێنە ٧ ) دروست دەكەین.



وێنە ( ٧ )

پاشان دەست نیشانی وێنەكەمانی دەكەین ئینجا لە شریتی زانیارییەكان داوای دەست نیشان كردنی خاڵی یەكەم و دووەم دەكات تۆش لەوشوێنەی كە دەتەوێت وێنەكەت كار بداتەوە ئەوا كلیكی لەسەر بكە پاشان دەپرسێت وێنەی یەكەم جار كە وێنەی سەرەكییە بسڕمەوە تۆش بەپێی كارەكەی خۆت yes یان no هەڵدەبژێری و ئەگەرNo مان هەڵبژارد ئەوا واتە وێنەی سەرەكی مەسڕەوە وەك (وێنەی ٨) شێوەكەمان دەست دەكەوێت.



وێنە ( ٨ )

# بەرنامەی فلاش Mx

زنجیرە( ١٠ )

ئا: فەیسەل مەعروف

## ئاخنینی فایلی فلاش لە لاپەرەی ویب

ئاخنینی فایلی فلاش لە لاپەرەی ویبدا یەکێ لە کارە گرنگەکانە، لەبەر ئەوەی ئێستا فلاش بەشێوەیەکی بەر بلاو بەکار دەهێنرێت لە ئەنتەرنێت، وە بۆ زیاد کردنی کاریگەری و جوولە بەمەبەستی بەخشینی جوانەیەکی زیاتر بە لاپەرەی ویب، بەدوو شێوە فایلی فلاش دەئاخنرێتە نێو لاپەرەی ویب:

١)ئاخنینی فایلی فلاش لەرێگەی بەرنامەی فرونت پێج:

أ- فایلە فلاشیەکە دروست دەکەین.

ب-لە لیستی سەرەکی فایلFile فەرمانی Movie Exportهەڵدەبژێرین و لە بەشەهاردەکان فایلەکە هەڵدەگرین و ناوێکی بۆ دادەنێین و بە شێوازی swf( لەرێگایەوە دەتوانین فایلەکە بئاخنینە لاپەرەی ویب) هەڵدەگرین ، پاشان ok دەکەین و پاشان دووبارە ok دەکەین ، سەیر دەکەین بەرنامەی فلاش هەڵساوە بەناردنە دەرەوەی فلیمەکە لە شێوەی Flash Player و بەهەمان ئەوناوەی خۆمان ناومان لێ نابوو.

ج- ئێستابەرنامەی فرۆنت پێج دەکەینەوە ، ئەو لاپەرەیە دەکەینەوە کە کارەکەمان بۆ رەوانە کردووە ، پاشان لە لیستی Insertدەچینە سەر Web componentلەوێشەوە دەچینەر advanced وPlug-ig هەڵدەبژێرین.(وێنەی١).



وێنە (١)



د-ئێستا پەنجەرەیەکمان بۆ دەکرێتەوە ، هەڵدەستین ئەو فایلە دیاری دەکەین کە دەمانەوێ بیئاخنینە نێو بەرنامەی فرونت پێج بۆ ئەم مەبەستەBrowser (استعراض) کلیك دەکەین پاشان پانی و درێژی فلیمەکە دیاری دەکەین ئینجا Okدەکەین.(وێنەی٢).

Plug-In Properties
Data source: 56.swf | Browse...
Message for browsers without plug-in support:
Size
Height: 128 | Width: 128 | Hide plug-in
Layout
Alignment: Default | Horizontal spacing: 0
Border thickness: | Vertical spacing: 0
Style... | OK | Cancel

وێنە (٢)

٢)ئاخنینی فایلی فلاش لەرێگەی زمانی Html:

أ-هەمان هەنگاوی (أ، ب) ی ئاخنین لە فرونت پێج دووبارە دەکەینەوە.

ب- ئەم کۆدەی خوارەوەکۆپی دەکەین ولەم شوێنەی کە دەمانەوێ چەسپی دەکەین

```
<embed width="550"height="400"
Src="http://www.yousitehere.com/thefilename.swf"
Type="application/x-shockwave-flash">
```

دووریەکان بە (بیکسل)ە (٥٥٠X٤٠٠ ) بیکسل.

# چۆن زیاتر لە یەك كەس دەتوانن لەسەر یەك ویندۆز XP كاربكەن ؟

نا : محمد ضیاءالدین

چۆن چەند كەسێك دەتوانن لەسەریەك ویندۆز XP كاربكەن بەشێوەیەك هەریەكەو بەرنامەی تایبەت بەخۆی هەبێت واتا بەرنامەی هیچیان لەلای ئەویتر نەبێتەوە بێگومان ویندۆز XP یەكێكە لەو سیستەمە بەهێزانەی كەتوانای زۆرشتی هەیە ئەوشتانە لەویندۆزەكانی تر بەسەركەوتووی ئەنجام نادرێت ئەمە ئاشكرایە یەكێك لەوبەهرەجوانانە بریتیە لە جیاكردنەوەی پارچەی روبەری شاشەو ناوەرۆكی هاردەكان ئەمەش زۆر پێویستە واتا تۆ لەدەزگایەك یاخود لەدوكانێك كاردەكەیت كۆمپیوتەرەكەت تایبەت بەخۆت نیە بەتەنها پاش تەواوبونی تۆ یەكێكی تر دێتە سەر كۆمپیوتەرەكەی تۆ كاری خۆی لەسەر ئەنجام دەدات وبەرنامەی پێویستی خۆی لەسەر كۆمپیوتەرەكە دادەبەزێنێت بەمەش دەبێتە هۆی تێكەڵبوونی بەرنامەكانی تۆو ئەو یاخود تێك چوونی سیستەم لەلای ئەو كە كاری بەسەر تۆوە هەیە سیستەمەكەی تۆش كارناكات و تێك دەچێت بۆ ئەمەش جیاكەرەوەی سیستەم زۆرپێویستە دابنرێت سەرەتا ویندۆزەكەت كەدانراوە دەبێت لەسەر سیستەمی NTFS لەبەرئەوەی لەسەر نیزامی Fat32 جیاكەرەوە نیە ئینجا دێیتە سەر هاردەكان ئەو پارچەیەی دەتەوێ بۆخۆت جیای كەیتەوە بەلای ڕاستی ماوسەكە كلیكێكی لەسەر دەكەیت و ئینجا Propertiesهەڵدەبژێریت لەوێوە Security كلیك دەكەیت لەوێوە Groupor user name دەركەوتوە بۆ نووسینی ناوی خۆتە هەروەها Permission دەكەیتە Full Control پاش ئەوكارانە Apply دەكەیت ئینجا OK دەكەیت بەم شێوەیە وێنە ١




وێنە ( ١ )

# چۆنیەتی وێنە گرتنی شاشە بەبێ بوونی بەرنامەی تایبەت

ئا: احمد ئیبراهیم

زۆرجار ئێمە پێویستمان بە وێنەیەکی شاشە هەیە بۆ کاری فێرکردنی بەرنامەکانی کۆمپیوتەر یان بۆ ڕوون کردنەوەی بابەتێك یان بۆ ئەو کەسانەی ئینتەرنێت بەکار دەهێنن دەیانەوێ لەناکاو وێنەیەکی شاشە بگرن .... هتد، ئیمە دەتوانین ئەم کارە بکەین بەبێ بوونی بەرنامەی تایبەت،ئەویش لەڕێگای دوگمەی( Print Screen)کە لەسەر کلیلی دوگمەکان (کیبۆرد)هەیە.بەڕێزان هەرکاتێك پێویستمان بە وێنەیەکی شاشە هەبوو یەکسەر پەنجە دەنێین بە دوگمەی Print Screen لە سەر کیبۆرد ،پاشان بۆ سەیڤ کردنی وێنەکە ئەم هەنگاوانە ئەنجام دەدەین :
دەچینە لیستی StartلەوێشەوەAllprogramsپاشانAccessoriesئینجا کلیك لەسەرpaintدەکەین بەرنامەکەمان بۆ دەبێتەوە (وێنەی ١) .



وێنە (١)

پاشان(ctrl+v)بەیەكەوە دادەگرین دەبینین ئەو وێنەیەی كە مەبەستمان بوو دێتە ناو بەرنامەكە (وێنەی ٢) .



وێنە (٢)

ئینجا دەچینە سەر لیستی فایل(file)وێنەكە بە ئارەزوی خۆمان لە شوێنێك سەیڤ دەكەین (وێنەی ٣) .



وێنە (٣)

# Microsoft Word لە ناو Main Toolbar

ئا: عبدالرحمن علی
abdolrahman4689@yahoo.com

ئەگەر بمانەوێت لە کردارەکانی ڕۆژانەمان دا لە ناو مایکرۆسۆفت وێرد ئەو فرمانانەی کە کاریان پێ دەکەین بە شێوەیەك بنووسرێن کە بۆ خۆمان تێی دەگەین یان ، بە وشەی کوردی بنووسرێن وەك: (open–ئۆپن و print–پرێنت و هتد...) ئەوە بۆ ئەوەی کە ئەو فرمانەی کاری پێ دەکەین بە خێرایی بیدۆزینەوە و بیناسینەوە، بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە پێویستە بەم شێوەیە بکەین:

لە ناو بەرنامەی وێرد کلیك دەکەین لەسەر tools ئنجا customize وێنە (١)




وێنە (١)

لە پەنجەرەی customize لــە بەشــی ســەرەوە کلیــك لەســـــەر commands دەکەیـــن ئنجا کلیك لەسەر دوگمەی Rearrange commandsدەکەین وێنە(٢)



وێنە (٢)

بۆ زیاد کردنی فەرمانێك لە لیستی file یان edit یان هتد.. ، کلیك دەکەین لەسەر دوگمەی Add ئنجا ok دەکەین لە پەنجەرەی Rearrange commandsوێنە (٣)



وێنە (٣)




بـــۆ گۆڕینـــی نـــاوی فەرمانەکە لـــە پەنجـــەرەی Rearrange commands کلیـــك لەســـەر دوگمەی Modify selection دەکەیـــن و لە شوێنـــی name ناوەکەی دەگۆڕین بەو ناوەی کە بۆ خۆمان دەمانەوێت وێنە (٤)

وێنە ( ٤ )

بۆ لابردنی فەرمانێك، ئەوە فەرمانەکە دەستنیشان (تحديد) دەکەین کلیك لەسەر دوگمەی Delete دەکەین وێنە (٥)




وە بۆ هێنانەوەی باری ئاسایی لیستی ئەو فەرمانانەی کارمان لەسەر کردوە کلیك لەسەر دوگمەی reset دەکەین لە بەشی خـوارەوەی پەنجـــەرەی Rearrange commands وێنـــە (٥).

بە هەمان شێوە دەتوانن هەموو لیستەکانی دیکەش بگۆڕن هەر بەو ڕێگایانەی سەرەوە.

وێنە ( ٥ )

# بۆ دانانـــــی شیفرە لەسەر تێکست




ئا : ئاسۆ فتاح

لە پاش بڵاوبوونەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بۆ یەکەم جار لە حوجرەی ،فەقێیەکان لەوانەیە هەر لە سەردەمی ئەمەویەکان دەستی پێکرد بێت ،مەلایەکان کە بیانوویستایە نامەیەك بنوسن بەڵام هەموو کەسێك دەرك بە خوێندنەوەی نەکات لەجیاتی (پیت) ژمارەیان دەنووسی،هەڵبەتە هەر پیتێك ژمارەی خۆی بۆ دانرابوو،بۆ نموونە لە جیاتی (بسم الله الرحمن الرحیم) ژمارە (٩٠٠) نۆ سەدیان دەنووسی کۆی ژمارەی هەموو پیتەکان دەکاتە نۆ سەد،بەڵام ئێستا لە پرۆگرامی کۆمپیوتەر دەتوانین پرۆگرامی وادابرێژین ، کە هەمان کاری پێشوو بکات بەڵام ئەمەیان گشتی نیە بۆ هەموو کەسێك کە شی بکاتەوە ، تەنها بەو پرۆگرامەی کە بۆی داڕێژراوە دەخوێندرێتەوە ،ئەوەش سوود و تایبەت مەندی خۆی هەیە بۆ هەندێ ئیش و کاری پێویست بێت نەزاندرێت، وە خوێندنەوەی ئەم جۆرە نامانە بەم سیستەمە زۆر خێرایە،هیچ کۆسپ ناخاتە بەردەم خوێنەرەکە.

سەرەتا کە پرۆگرامەکە دەکەینەوە پێمان دەڵێت تا ئێستا چەند جارت کردۆتەوە وە چەند جاری تر دەتوانی بیکەیتەوە.

Aya

وێنە (١)

Aya



پاشان کلیك لەسەر (Aya) دەکەین



وێنە (٢)

لە دوو بەش پێك دێت text وە Binary وە لە بەشی خوارەوە کە نووسراوە ٤٩ واتە ئەم پرۆگرامە ٤٩ جار کراوەتەوە،وە زیاتر لە ٥٠ جار ناکرێتەوە. لە بەشی text دەتوانین نووسین بکەین، وە ئەگەر نووسراومان هەبێت لە فایلی تێکست یا وۆرد دەتوانین داتاکەی ناوی وەربگرین، بە کلیك کردن لەسەر لیستی فایل پاشان کلیك لەسەر Open Text بۆ کردنەوەی فایلەکەمان. وە بۆ BINARY هەمان هەنگاو ئەنجام دەدەین....



وێنە (٣)



بۆ نموونە




وێنە (٤)

ئەگەر لەبەشی تێکست بنووسین کوردستان وە پاشان بچین بۆ لیستی Converter وە کلیك لەسەر text to binary دە کەین




وێنە (٥)



وە دەبینین کە نوسینەکەمان دەچێتە بەشی Binary بەم شێوەیە




وێنە (٦)

ئێستا دەتوانین ئەم ژمارانە Save بکەین بە کلیك لەسەر Save Binary لە لیستی فایل




وێنە (٧)



وە لەبەشی text دەتوانین نووسین بە ئینگلیزی بکەین، وە بۆشمان دەخوێنێتەوە بە کلیك کردن لەسەر Read text لە لیستی Reading




وێنە (٨)

وە ئەگەر بمانەوێت زیاتر لە ٥٠ جار بیکەینەوە ئەوا کلیك دەکەین لەسەر Registry لە لیستی help ، ژمارە نهێنیەکە داخل دەکەین... بۆ زیاتر زانیاری پەیوەندی بکە بە سایتی http://www.t4kurd.com




وێنە (٩)

# بەرنامەی Maintenance Wizard

ئا: محمود محمد سالەیی
mehmud_felek@yahoo.com

ئەمە بەشێکی چاك کردنەوە کۆمپیوتەرە کە سیستەمی ویندۆز خۆی لەگەڵیدایە بۆ خێرا کردن و سڕینەوەی فایلی یادەی نــاو ئامێرەکەو چــاك کردنـــی هەڵەو ... هتد و وەکـــو ئاگادارکەرەوەیەکیش وایە (منبە). بڕۆرە ســەر (Start) و (All Programs) و (Accessories) و (System Tools) و لەوێشەوە (Maintenance Wizard):

چوارچێوەی سەرەکی دێت و (OK) و لەوێشەوە دوو هەڵبژاردن ئەدات:

- (Express) شێوە ئاساییەکەیەتی کە ئێمە مەبەستمانە.
- (Custom) ئەمەیان تۆ خۆت چۆنت بوێ بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا ئەکەیت.





لە دواییدا (Next) دائەگرین وەك وێنە (١) دواتر دێتە سەر بەشی (Schedule) ئایا شەوانە یاخود سەر لە ئێوارە یان بەرۆژەوە دەست بەکارەکە بکات کە لەوێنە (١)دا دیارە. دواتر ئەو کارانەت پیشان ئەدات کە بۆت ئەنجام ئەدات وەك (خێرا کردن و سکان دێسك و دیفراگ و سڕینەوەی فایلە زیادەکان). ئینجا (Next) دائەگرین و دەست بەکار ئەبێ و چوار چێوەیەك دێت ئەڵێ: ئەتەوێ ئێستا دەست بەوکارە بکەم یاخود ئەو کاتەی تۆ دیاریت کردووە تەنها بەلێدانی نیشانەی ڕاست بۆ بۆ بۆشاییە بچووکەکە ئەوە ئەگەیەنێ کە لە ئێستاوە دەست پێ بکات.. وەك وێنە: (١) بەشی ژمارە (٣). دواتر دەست ئەکات بە سڕینەوەی فایلە زیادەکان و (Scan Disc & Defragment) و کۆتایی ئەهێنێ بە زیاد کردنی خێرایی ئامێرەکە. وەك وێنە (٤)

# کاردانەوەی کۆمپیوتەر له هونەری وێنەگرتن

ڕیپۆرتاژ و فۆتۆ / ڕێناز ئەردەلان بکر

لەگەڵ ئەوەی تەکنەلۆژیایی سەردەم کاردانەوەو ڕەنگ دانەوەی خۆی هەیە لە گشت بوارەکانی ئەم سەردەمەی ژیاندا هونەریش یەکێکە لەو بوارانەی کە کۆمپیوتەر کاری تێکردوە یەکێك لەم بوارە هونەریانە هونەری وێنە گرتنە بە هەردوو جۆری فۆتۆ و ڤیدیۆ . ئایا کۆمپیوتەر هیچ ئاسانکاریەکی بۆ ئەم بوارە کردووە ؟ ئایا لایەنی ئیجابی یاخود سلبی زیاترە ؟ ئایا سیما و هەستی هونەری سروشتی وێنە بەهۆی بەکارهێنانی ئەم ئامێرەوە وەك خۆی ماوە یاخود گۆرانکاری بەسەر داهاتووە ؟ لە وەلامی ئەم پرسیارانە ئەم بەرێزانە ووتیان :



**سەرەتا / هونەرمەندی فۆتۆگراف هاوار صدیق دەڵێت :**

کەسی پسپۆر لە وێنە گرتندا ئارەزووی ئەوا دەکات دراما لە وێنەکانی بەکار بهێنێ واتا زیاتر ئەو بۆچونانە بەکار بهێنێ کە لە مێسکی ئەو دان بۆ نمونە شتێك کە خۆت بە دەستی دەیکەی زۆر جوان و نرخ و بایەخی خۆی هەیە وەك ئەوەی بە ئـامێر دروستی بکـەی کاتێك ئێستا سەیری سینەماش دەکەین زۆر لە ڕاستی دورە چێژە هونەریەکەی جارانی نیە خێرایەکی زۆری تێدایە کە پێچەوانەی خێرایی چاوی مرۆڤە کە ئەمانەش زیاتر هۆکاری سلبین بەڵام بۆ ئیش و کاری دام و دەزگاکان بۆ کارە زانستیەکان سوودی خۆی هەیە بەڵام لە هونەری فۆتۆگۆاف بە باشی نازانم من لەو خاڵەدا دەیبینمەوە داهێنانی مرۆڤەکەی تێدا نامێنێ واتا هونەری کارەکە زیاتر ئامێرانەیە نەك مرۆڤانە .



**بەرێز جەنگیز محمد سعید وێنەگر لە بەرێوەبەرایەتی سینەما دەڵێت :**

کۆمپیوتـەر کاریگەریـەکی زۆری هەیـە لەسـەر هونـەری وێنەگرتن پێشتر وێنە گرتن بایەخێکی بەرزی هەبوو ئێمە کە وێنەیەکمان دەگرت زۆر خۆمان بۆ ماندوو دەکرد ڕووناکیمان بۆ دادەنا بەڵام ئێستا ئەو شتانە نەماوە بەهۆی کۆمپیوتەرەوە بۆ ماوەی سێ خولەك وێنەکەت بۆ دەشۆنەوە بەڵام لای من ئەو جوانیەوە هەستە هونەریەی جارانی تێدا بەدی ناکەم بە تایبەتی ئێستا بە هۆی ئەو کامیرا دیجیتاڵانەوە کە ئەو بایەخ و هەستەم ناداتێ کەوا من پێشتر لە وێنە ڕەش و سپیەکان بەدیم دەکرد .





**خاتوو نیاز عبدالله ڕۆژنامە نووس بەم شێوەیە ئاماژەی بە ووتەکان دەدات :**

هەر کاتێك کە داهێنانێکی تەکنەلۆژی بەرهەم هێنرا کۆمەلێك گۆرانکاری لەم بوارەدا دروست دەبێت کاتێك کە کامیرای جۆری دیجیتالٌ دەرکەوت کە ڕاستەخۆ بە کۆمپیوتەرەوە بەستراوەتەوە لێرەشەوە جۆرێك ئاسانکاری لە وێنە گرتندا دروست بوو چونکە قۆناغەکانی تر کە لە وێنە گرتنی کامێرای ئاسایی دا هەبوو قورستر بوو بۆ نمونە قۆناغەکانی شوشتنەوەی وێنە کە کۆمپیوتەر کار ئاسانی کرد بۆی بە تایبەتی ئەو وێنانەی کە بۆ ڕۆژنامە بەکار دێن هەروەها بۆ بوارەکانی تری دیزاین زۆر یارمەتی دەر بوو بەلأم لە هەمان کاتدا ئەو سادەو ساکارییەی کە پێشتر لە وێنە دا هەبوو مەبەست لە سروشتی وێنەکەی گۆرانکاری بەسەر دا هات بە جۆرێك دەستکاری تەکنەلۆژیای پێوە دیارە هەر چەندێك ئەو وێنەی ئاساییانەی کە پێشتر هەبوون چێژێك لە وێنە گرتن و کاتی شوشتەوەی دا هەبو سەرەرای ئەوە هونەریشی زیاتر تیادا بەدی دەکرا چوونکە هەموو شتەکان دەست و چاو لە رێکخستنیدا رۆلیبان دەبینی و وێنەکە وەك خۆی دەبینرا بەلأم لە داهێنانی کۆمپیتەری دا سەرەرای خێرای لە کارەکان بە دەستکاری لە وێنەکانەوە دەبینریٚ کە هەندێك جار لە سروشتی بوونی وێنەکان دەکوژێت .



**بەرێز تۆفان ابوبکر وێنەگری سینەمای گووتی :**

ئەو خاسیەتەی پێشتر لە هونەری فۆتۆگرافی رەش و سپی هەبوو جۆرێك لە جوانی هەستی سروشتی تێدا بوو بەلأم بەهۆی ئەو پێشکەوتنەوە ئەو هەستەی جارانی تێدا بەدی ناکرێت ڕاستە کاتەکەت بۆ کەم دەکاتەوە واتا لە چاو جاران زووتر بە دەستت دەگات یاخود سودی کۆمپیوتەر بۆ زیندوکردنەوەی وێنە کۆنەکان بەلأم لەگەلٚ ئەوەش جێیکی هونەری سروشتی تێدا بەدی ناکرێت .




**بەڵام بە پێچەوانەی بۆچوونەکانی ئەم بەڕێزانە بەڕێز مصدق جعفر دەڵێت :**

من زیاتر کاردانەوەی کۆمپیوتەر لەسەر هونەری وێنە گرتن بە باشە دەزانم بە تایبەتی ڤیدیۆ کە زۆر شت دەتوانین بە هۆی کامیراوە ئەنجام بدرێت بە تایبەتی ئەو ئامێرە سەردەمیانەی وێنە گرتن بە هۆی کۆمپیوتەرەوە لە کاتی مونتاژ نیوەی کارەکەی تر تەواو دەکات بۆ نمونە کاتێك وێنەیەك دەگریت ئەو وێنە نی یە کە دەتەوێت بەڵام بەهۆی کۆمپیوتەرەوە چارەسەر دەکرێت بۆیە زیاتر لایەنی ئیجابیات دەبینمەوە لە بەکارهێنانی کۆمپیوتەر نەك لایەنی سلبی .

**بەڕێز مەولود ابراهیم بەرزنجی وێنەگر دەڵێت :**



تەکنەلۆژیای نوێ یارمەتی دەرێکی باشی کاری هونەری و فۆتۆگرافیە کە دەتوانرێت لەڕێگەی چەند بەرنامەیەکی کۆمپیوتەر وەکو ( فۆتۆشۆپ ) چارەسەری زۆر لەو فۆتۆیانە بکرێت کە ئێمە چۆنمان دەوێت وا دەربچێت بە تایبەتی لە ڕووی جوانکاری و ووردبینی وێنەکان دەکرێت بڵێن کۆمپیوتەر ئاسانکاریەکی زۆری هێناوەتە بواری فۆتۆ گرافی کە بە خێراترین کات و بە جوانترین ووردبینی وێنەکانمان دەخاتە بەردەست و بە بەراورد لەگەڵ سەردەمانی کۆن و بە کامیرای کلاسیکی کە کارەکان ئەنجام دەدا بە بۆچونی من کاری فۆتۆگرافی بە یارمەتی کۆمپیوتەرو ئامێری نوێ جگە لە بوونی ئیجابیات لەسەر کارەکە هیچ سلبیاتێکی نیە .

# قەبارەی پێنج گێگا بایت بۆ پۆستێکی ئەلیکترۆنی

ئا : شاخەوان عمر حەسەن

قەبارەی پۆستە ئەلیکترۆنیەکان و قەبارەی ناردنی نامەکان دوو رەکیزەی سەرەکین لە پۆستە ئەلیکترۆنیەکان هەبێت تا ئێستا سایتەکانی یاهۆو و گۆگل و سایتی مەکتوب بە پێشەنگی سایتەکانی پێدانی پۆستی ئەلیکترونین بەلام لە ئەنجامی کێبرکێ سایتەکان لە سەر راکێشانی زۆرترین میوان و زۆرترین بەکارهێنەر هەریەکەیان لە زیاد کردنی بری قەبارەی پۆستی ئەلیکترۆنی دابون وەکو لای هەموومان ئاشکرایە لەم کێبرکێیەدا ئەوانەی سود مەند دەبن بریتین لە بەکارهێنەران لە هەموو جیهان . سایتی www.walla.com سایتێکە بە سادەترین شێوە دارێژراوە وە بری پێنج گێگا بایت پۆستێکی ئەلیکترۆنی دەبەخشێت بە بەکارهێنەران و بەو کەسانەی کە دەیانەوێت ببنە خاوەنی پۆستی ئەلیکترۆنی لەم سایتەدا بە خۆرایی وە کارکردن تیایدا زۆر ئاسانە بڕوانە وێنەی (١) وێنەی روکاری سایتەکەیە .

Walla! - free 3G mail - Microsoft Internet Explorer

File Edit View Favorites Tools Help

Address http://www.walla.com

walla! me

User Name: Password: Sign In >>
Forgot your password?

New user? - Sign up for a-free 3G mail account.

Copyright © 2004 Walla! Communications LTD. All rights reserved

wallaime | Privacy Policy | Terms of Use

وێنە (١)



ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەم سایتە لەڕوی دیزاین و لە ڕوی کارکردن تێیدا لە سەر شێوەی سایتی یاهۆ نزیکە تەنانەت لە شێوەی نامە ناردن و نامە وەرگرتندا . بروانە وێنەی (٢)



وێنە ( ٢ )

کە روکاری ناوەوەی پۆستەکەیە . کارکردن لەم گۆڤارە بۆ ئێوە جێدەهێڵم بەڵام چۆنیەتی دروست کردن لەم پۆستە دا باس دەکەین . دوای کردنەوەی سایتە کە وەك لە وێنەی (١) دیارە . دێین کلیك لەسەر کلیك لەسەر ( Sign up for a free 3G mail account) دەکەین پاشان فۆرمێك دەکرێتەوە دێن ئەم فۆرمە پڕ دەکەینەوە بروانە وێنەی (٣) کەمن بەناوی گۆڤار پرم کردۆتەوە . دواتر دەبینە خاوەن پۆستێکی ئەلیکترۆنی .



وێنە ( ٣ )

تێبینی: لە کاتی پڕ کردنەوەی زانیاریەکاندا نووسراوە ٣ گێگابایت بەڵام لەگەڵ تەواو بوونی ودروست کردنەکە دەبینین کە ٥ گێگابایت بۆشاییت هەیە.

# ماڵپەری گۆگڵ پێشکەوتنێکی تر بەخۆیەوە دەبینێت

ئا: ئەژین ئازاد



وێنە (١)

www.google.com ناونیشانی یەکێك لەگەورەترین بزوێنەرەکانی گەڕانە لە جیهاندا کە توانای گەڕانی هەیە لەناو زیاتر لە چەندان ملیۆن سایتی تۆمار کراو لـــەم بزوێنەرەدا وەهەروەهـــا لە ئەنجامـــی ئـــەو سەرکەوتنە مەزنەی کە بەدەستی هێناوە چەندان خەڵاتی جـــۆراو جۆری لەســـەر ئاستە جیاوازەکانی بواری ئەنتەرنێت وەرگرتوە . لەگـەڵ ئەمەشدا ئەم سایتە چەنـدان خزمـــەت گـــوزاری تری پێشکەش بە بەکارهێنەرانی دەکـــات . تا ئەو ئاستەی بەشی کـــوردی لەم ماڵپـــەر لەسەر دەســـتی چەنـــد دڵسۆزێکی کـــوردی بواری ئەنتەرنێت و کۆمپیوتەر کرایەوە کە بەم شێوەیە دەچێتە سەر ئەم بەشە (http://www.google.com/intl/ku) بڕوانە وێنەی (١) .



وێنە (٢)

ئێمە قسە لەسەر دوبەشی زیاد کراو دەکەین لە گۆگڵدا ئەوانیش بەشی هەواڵ و بەشی وەرگێرانە لە سەرەتا دێین بـاس لـــە دەنگ وباس دەکـــەین لەم بەشـــە نوێیەدا گۆگڵ خزمەت گوزاری گەران بەدوای هەواڵدا زیاد کردوە کە دەتوانێت بە هۆیەوە لەناو زیاتر لە ١٥٠ سەرچاوەی هەواڵی جیهانی بگەرێت وە بەردەوامیش نوێترین هەواڵـــی جیهـــانت پێشکەش دەکات. کارکردن و گەرانیش وەکو هەر گەرانێکی ترە بۆ نمونە من داوای هەواڵ دەکەم لەبـــارەی کۆمپیوتەر نوێترین هەواڵم دەداتێ بڕوانـــە وێنەی (٢) لە هەمـــان کاتدا وەکو لە بەشی راستی وێنەی (٢)دیارە

هەواڵەکان بۆ هەواڵی گرنگ و جیهانی و هونەرو زانست و ئابوری جیا کراونەتەوە کە ئەمەش ئاسانکاریەکی زۆر باشە . بەم خزمەت گوزاریە نوێیە بەردەوام ئاگاداری هەموو جۆرە هەواڵیکی جیهان دەبیت بەبێ ماندوبونێکی زۆر .

دووەم خزمەت گوزاری بریتیە لە کاری وەرگێران لەم سایتەدا بۆ ئەم کردارەش وەرگێرانی هەموو ماڵپەرێکی بیانی بۆ زمانی عەرەبی کە لەمەشدا ئێمە سودێکی زۆر دەبینین چونکە لەزمانی عەرەبی شارەزاترین وەك ئەوەی زمانەکانی تر . ئەم خزمەت گوزاریە بەکارهێنانی زۆر ئاسانە چونکە دوای گەڕان لە هەر بابەتێك هەر پەڕەیێکی وێب بیانی بێت خۆکاری لەتەنیشتی دەنوسێت (ترجم هذه الصفحة) ئەم سایتە وەرگێرە وەك لەوێنەی (٣) دیارە

computer - بحث Google - Microsoft Internet Explorer

Computer
Offers on Home & Business notebooks with Intel Dual-core. Visit us now
www.toshiba-gulf.com

IEEE Computer Society
The IEEE Computer Society is one of the major international professional bodies for IT professionals
www.computer.org/ - 20k

IEEE -- Computer Magazine
Flagship magazine of the IEEE Computer Society, where computing practitioners, managers, and researchers share experience, solve problems ...
www.computer.org/computer/ - 31k

Apple Computer Inc
Official site of Apple Computer, Inc
www.apple.com/ - 29k

Computerworld Magazine
News and product coverage for information technology managers
www.computerworld.com/ - 115k

Whatis.com definitions, computer terms, tech glossaries and cheat ...
Definitions on thousands of the most current IT and Computer related words
whatis.techtarget.com/ - 87k

Jeff Han Interface
Computer Screen. See Breathtaking Invention in his TED Conf Talk Now
JeffHan.TED.com

Vaio TX 37SP
sony.co.th

Computers Top 20
Top computers websites
Find the best computers here
computers.feedigg.com

Hardware Jobs in Dubai
1000s of Hardware Jobs for Gulf Nationals. Apply Free Online Now
NaukriGulf.com

وێنە (٣)

# ڤایرۆسکی نویٚ ناوی کورجۆ یــە

وەرگێرانی لە عەرەبییەوە: زەهرە حەسەن موحەمەد
سەرچاوە: موقع المشاغب

ئەو ڤایرۆسە نوێە توانای ناسینەوەی شوێنی پەنجەکانتی هەیە لەسەر تەختی دوگمەکان هەروەها وشە نهێنێکان و ژمارەی فیزاش دەگرێتەوە . ئەم ڤایرۆسە کە ئەو ئامێرانە تووش دەکات کە بە هەردوو سیستمی ویندوز ٢٠٠٠ و اکس بی ئیش دەکات بەردەوامە لە بلاو بوونەوەدا بۆ هەموو جیهان کاتیٚ کە پەیوەندی دەکرێت بە تۆری ئەنتەرنێتەوە دەست دەکات بە چوونە ژوورەوەی جاسوسیێکی وردبین کە توانای تۆمار کردنی ئەو دوگەمانەی هەیە کە بەکاری دێنین لە کاتی نهێنیدا وەکو داخل کردنی ووشەی نهێنی . ئەم ڤایرۆسە بۆ یەکەم جار پەیدابوو لە ٢٢/ ایار / ئیستا لە شەش جۆردا بلاو بووەتەوە بە لای کەمەوە . چارەسەرکردنی ئەم ڤایرۆسەش بەرنامەیەکی خۆرایە بە ناوی (کیە بی ٨٣٥٧٣٢) لە سایتی مایکروسوفت بەلاّم بەکارهێنەرانی کۆمپیوتەر رایاندگەیاند بلاوْ بوونەوەی ئەم جۆرە ڤایرۆسە کە تووشی میلونەها ئامێری کۆمپیوتەر بووە تا ئێستا ئەو چارەسەریان بەکار نەهێناوە . کریستوفر فیشر کە شارەزایەکی المانی یە لە بواری ڤایرۆسەوە دەڵێت تا ئێستا هیچ پێشنیارێك نییە بۆ ئەوەی کە کورجو بووەتە هۆی زیاد کردنی جولاّندنی رۆیشتن لە ئەنتەرنێت . ئەم کرمە هەمان شوێن پێی ڤایرۆسی ساسر دەگریٚ کە گەورەترین ڤایرۆس بوو لە جیهاندا لە نیسانی ٢٠٠٥ بۆ چوونە ژوورەوە . ڤایرۆسی کورجو تووشی ویندۆزی ٩٨ نابیٚ یان هەر سیستمێکی تر جگە لە ویندۆزی ٢٠٠٠ و اکس بی . لێرەدا ئەو کۆمپانیانە کە تایبەت مەندن بە دروست کردنی بەرنامەکانی دژە ڤایرۆس دەستی کرد بە تاقیکردنەوەکانی بۆ دابین کردنی بەرنامەیەك دژی ئەم ڤایرۆسە دوای ئەوەی کە مەترسی کورجو هاتە کایەوە و بینی بلاو بووەتەوە . دوای ئەوەی کە کورە لاوی المانی دانی نا بە دروستکردنی ڤایرۆسی ساسر بە هۆی ئەوەی کە ئەم ڤایرۆسە دژی ڤایرۆسەکانی ترە . کومپانیای اف سیکیور کە کومپانیەکی فنلندیە بۆ دروست کردنی بەرنامەکانی دژە ڤایرۆس روونی کردەوە کە کورجو بەرهەمی کۆمەڵێك هاکەرزی رووسیە کە ناوی خۆی دەنیٚ "**فریق المتطفلین**" رۆژنامەنووس ( توماس کریتشمان ) لە گۆڤاری بی سی المانی ووتی ئەم هاکەرزەی کە ڤایرۆسی کورجوی دروست کردووە پێویستی بە ئیشیەکی زۆر بووە لە ئیشی شیکردنەوە بۆ جیا کردنەوەی لێدانی دوگمەکان کە تایبەتن بە وشەی نهێنی یان بتاقەی تئەمین لە تەختی دوگمەکانی تایبەت بە کۆمپیوتەر . هەروەها ووتی ئەم ڤایرۆسە توانای ئەوەی نییە شفرەی خزن کراو لە هاردا بدۆزێتەوە . هەروەها کومپانیای ( سوفوس ) بۆ فرۆشتنی بەرنامەکانی دژە ڤایرۆس رایگەیاند کە ژمارەی ڤایرۆس لەسەر تۆری ئەنتەرنێت

لە مانگی ایار دا گەورەترین ڕێژەی تۆمار کرد لە دووساڵ و نیو لە مانگی ڕابوردودا . هەروەها سوفوس ئەوەی ڕاگەیاندووە کە لە مانگی ایار دا ٩٥٩ ڤایرۆسی نوێی لەسەر تۆری ئەنتەرنێت بینێتەوە ئەم گەورەترین ژمارەیە تا ئێستا تۆمار کراوە لە کانونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠١ وە . وە بەرەهەکانی ئەم کومپانیا دژی ٩٠٨١١ جۆری ڤایرۆسن . هەروەها ڕایگەیاند کە ساسر لەسەروی مەترسی ترین دە ڤایرۆس بووە لە مانگی ایار . شایانی باسە ڤایرۆسی کورجو لە ڕیچگای نامەی ئەلیکترونیەوە ( E-mail) نایتە ناو کۆمپیوتەرەوە بەڵکو لە ڕێگای تۆری ئەنتەرنێت وە کە دەبێتە هۆی ریستاردی کۆمپیوتەرەکە لە هەموو ٦٠ سانیەدا هەروەها دەبێتە هۆی لاوازی تۆری ئەنتەرنێت .



# سایتێك بۆ دابەزاندنی هەموو جۆرە فۆنتێك

ئا: هۆگر هاشم

فۆنت سەرچاوەیەکی سەرەکیە بۆ کۆمپیوتەر لەبواری نوسین و بەرنامەدا وە هەروەها بۆ ویندۆز ، فۆنت دەبێتە هۆی ئەوەی جوانکاری لەنەخشەسازی نوسین و پەرتوك و بلأوکراوەکان بۆیە ئێمە دەبیٚ پشت بەو فۆنتانە ببەستین تاوەکو هونەری جوان بنوسێت لەناو نەخشەسازی نوسین بەهۆی ئەم سایتە دەتوانن جوانترین فۆنتی جۆراو جۆر هەڵببژێرن سوودی لێوەربگرن ، بۆیە لەسەرەتا بەکردنەوەی

http://www.webpagefonts.com/

Free Fonts To Download

www.WebpageFonts.com

Below are over 6500 free fonts you can download to your computer and use for free. These are free TTF fonts made to work with any PC or Windows Based Operating System.

After downloading any of these free TTF fonts to your computer you must install them in the "Font" file folder of your Windows file folder found under the C: drive in your Windows Explorer program. Your Windows file folder, found under the C: drive of your Windows Explorer program, is often listed as "WINDOWS" or "WINNT." Under your WINDOWS or WINNT file folder you will see a folder listed as "Fonts." Simply drag and drop any of the fonts you download to your computer into your "Fonts" file folder. You will then be able to use any of these free fonts within any program on your computer.

وێنە ( ١ )

پاش ئەوەی کە سایتەکەمان بۆ دەبێتەوە دەچینە سەر پیتەکانی کە بەڕەنگی شین نووسراون ئەگەر لەبەشی پیتی (W) کلیك بکەین ئەوا هەموو جۆرە فۆنتەکانی پیتی (W) دەبیتەوە کەبەشێوەی روون دیارن



وێنە ( ٢ )

ڕە ئەگەر بمانەوێ خەزنی بکەین بۆ ناوکۆمپیوتەرەکە کلیك لەسەر جۆرە فۆنتێك دەکەین وە هێمای خەزنکردن دەردەچێت و لەکام شوێن بمانەوێ هەڵیبگرین شوێنەکەی بۆ دیاری دەکەین وە نابێ ناوی فۆنتەکە بگۆڕین چونکە فۆنتەکە کار ناکات


وێنە ( ٣ )

# بزوێنەری هارد دێسك بە تەكەنەلۆجیایی "PMR" ی پێشكەوتوو

ئا: سۆزان سلێمان
سەرچاوە: وێسترێن دیجیتاڵ
ئامەی ئەلیكترۆنی: sevda_sso@yahoo.com

كۆمپانیای (وێسترێن دیجیتاڵ) ئەمەریكی كەلە بواری دروست كردنی بزوێنەری هارد دێسكەكان كاردەكات، ڕایگەیاند داهێنراوێكی نوێی لە بزوێنەری هارد دێسك دروست كردووە بەناوی (دی دەبل یو سكۆربیۆ). ئەم داهێنراوە نوێیە پشت دەبەستێ بە تەكەنەلۆجیای كۆگەكردنی مۆگناتیسی پشت بەستوو بە هەموو بازنە PMR یەكان كە وێسترێن دیجیتال دایهێناوە وە ڕێگەدەدات بە كۆگەكردنی ٨٠ گیگابایت لەسەر هەر بەشێكی بازنەیی لە بەشەكانی هارد دێسك، هەروەها هەڵدەستێ بەریزكردنی هەموو بیتێكی زانیاریەكان بەشێوەی ستوونی لەسەر هاردی كۆگەكراوی بازنەیی لە جیاتی ریزكردنی بەشێوەی درێژكراو كە بزوێنەری هارد دێسكەكانی پێشوو پەیڕەویان دەكرد. وە ئەم جۆرە كردارە بڕی كۆگەكردنی زانیاریەكان زیاد دەكات لەسەر هارد بە بەراورد لەگەل كرداری تۆماركردنی درێژكراوی زانیاری، كە دەبێتە هۆی زیاد كردنی بواری كۆگەكردنی زانیاری لەسەر بزوێنەری هارد دێسكەكان لە داهاتوودا. وە پێویستی بە بڕێكی دیاریكراوی وزەی كارەبا هەیە بۆ كارپێكردنی بە خێرایی ٤٢٠٠ خول لە خولەكێكدا، وە ئەمەش دەبێتە هۆی كەمكردنەوەی بەكارهێنانی وزەو بەهۆی ئەمەشەوە تەمەنی پاتریەكەی درێژ دەبێتەوەو ئاستی پشت پێبەستنی زیاد دەكات.



# کۆمپیوتەر
# لە بـــــــواری دارتاشیدا

ئا: هاوکار کۆیی

ئازیزان لەسەردەمی تەکنەلۆژیای سەردەمدا زۆرینەی کارە دەستیەکان ئێستاکە بەهۆی کۆمپیوتەرەوە زۆر ئاسانکاری کراوە لەهەموو بوارە جیاکانی مرۆڤ بۆیە یەکێك لەکارە سەرەکیانە کاری دارتاشیە لە هەموو ڕووەکانیەوە ، لە ڕووی دروستکردنی پێشانگای ماڵان کورسی و دۆڵاب و جام خانەوە بەرنامەی (پلان) زۆر بەئاسانی دەتوانن نەخشەیەکی جوان بۆ خۆتان دروست بکەن ، لەپێشان بەهۆی ئامێری چاپەوە ڕابکێشن دواتر کاری لەسەر بکەن



وێنەی (١)

لەسەرەتادا لەلای دەستە ڕاستی خۆمان دەچینە لەسەر پرۆگرام (program) بەویستی خۆمان بەشێك دەكەینەوە كە



وێنەی (٢)

وێنەی ئەو جۆرە پێشانگایە هەڵدەبژێرین كلیك دەكەین لەلای دەستە چەپەوە ڕووبەری شوێنی كارمان پێنیشان دەدا.



وێنەی (٣)

لەسەرەتادا لەلای دەستە ڕاستی خۆمان پاش کلیك کردن لەسەر پێشانگایەکە ئەوا ئەم جۆرە چۆن دروست کراوە ئاو
هی پارچەکانی شی دەبنەوە وە لەسەر هەرپارچەیەك کلیك بکەین ئەوا درێژی و پانی پارچەکەمان بۆ دیار دەکات و
ئەو پارچانە یەك بە دوای یەك ڕایبکێشە بۆ ڕووبەرەکە دەبینین هەمان پێشانگاکەمـــان بۆ دەردەچێت لەسە
پرۆگـــرام (program) بەویستی خۆمان بەشێك دەکەینەوە کە کەرەستەکان و وێنەکانی تێدایە پاش هەڵبژاردنی
ـەشەکە



وێنەی ( ٤ )

ـە ئەگەر کێشەیەکمان هەبوو ئەوا دەتوانین لەسەر پێشانگایەکە کلیکی لای ڕاست بکە ئەوا وێنەی پێشانگایەکەت
ـی نیشان دەدات و دەتوانین جۆری تازەتر دروست بکەیین



وێنەی ( ٥ )

لەپاش تەواوبوٚنی نەخشەکە دەتوانین هەڵی بگرین دەچینە سەر فایل (file) وە لەوێشەوە بوٚ (xport image)
ئینجا بە ناوێك وە بە (jpg) هەڵی دەگرین



وێنەی ( ٦ )



وێنەی ( ٧ )

تێبینی : ئەم بەرنامە دەبێ لەگەڵ ئەنتەرنێتەوە ببەسترێت ئینجا کاردەکات بەشێوەیەکی ئاسان و هاوپێچەکانی ئەم بەرنامەیەدا

# زۆرترین مۆبایلی دزراو لەجۆری نۆکیایە!

و: لەئینگلیزیەوە: سۆران سلێمان
سەرچاوە: هەواڵی گوگڵ

نزیکەی نیوەی ئەو مۆبایلانەی کەلە ساڵی ٢٠٠٥ دزراون لەلایەن کۆمپانیایی نۆکیا دروست کراون، ئەمەش بە گوێرەی لیکۆلینەوەیەکی نوێ. بە گوێرەی لێکۆڵینەوەکەی ناوەندی میدلاندس بۆ تاوانزانی و دادوەری تاوانکاری لە زانکۆی لۆفبرۆ، بە پشتبەستن بە ١٠٠,٠٠٠ ڕاپۆرتی دزینی مۆبایلەکان لە لەندەن بۆ دەستنیشان کردنی زۆرترین ١٠ خشتەی مۆبایلە دزراوەکان. نۆکیا ٦٢٣٠ لە هەموویان زیاتر دزراوە لەوەتی کانونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٥ وە، لە دوای ئەویش مۆتۆرۆڵە ، سەمسونگ D500 وە سۆنی ئەریکسۆن K750i .

"دزینی مۆبایل هەنگاوبە هەنگاو ڕوو لەزیادبوونە لە کاتێك زۆر جۆری تاوان ڕوو لە کەمبووندایە لەم ساڵانەدا"، بە گوێرەی ووتەکانی (جان مەیڵی)، داهێنەری سەرەکی لێکۆڵینەوەکە.

"بەرزترین ١٠ خشتەی مۆبایلە دزراوەکان هەنگاوێکی دروستە بۆ هاندانی کۆمپانیاکانی مۆبایل دروستکردن بۆ ئەوەی تواناى خۆیان برەوپێبدەن بۆ داهێنان و دروستکردنی مۆبایلی دژە تاوان (واتا مۆبایلی زیرەك و بەرگری کەر لە دزران)." لەمەوپێشدا تۆڕەکانی خزمەتگوزاری مۆبایل هەڵساون بەلە کارخستنی مۆبایلە دزراوەکان لە ماوەی ٤٨ کاتژمێردا دوای دزرانیان، بۆ ئەوەی هاندەکە بێسوود بێت.


Sony Eriksson K750i


Samsung D500


Motorola



Nokia 6230

# یاری (carshday) ئۆتۆمۆبێلی جەنگی

ئا: دارەوان


وێنەی (١)

خۆشەویستان و ئارەزوو مەندانی یاری ، یاری ئۆتۆمۆبێلی جەنگی یارییەکە کەباس لەسەرپێچی کەرانی هاتوو چۆ دەکەن بە شێوەیەکی پێشبرکێی، وە ئەم یارییە بەم شێوەیە کار دەکات ،



وێنەی (٢)

لە سەرەتاوە پاش کلیک کردن لەسەر ئایکۆنی یاریەکە دەچینە سەر (single event) بۆ چوونە

پاشان ئەو شێوە یاریە هەڵدەبژێرین کە دەمانەوەێ ئەویش جۆری جەنگی وە جۆری ئاسایی وە جۆری مەشقی ، ئێمە جۆری ( wrecking) کەجۆری جەنگیە .



وێنەی ( ٣ )

لەپاشان ناو وجۆری مۆدیل و جۆری گێر تۆماتیك یان گێری ئاسایی هەڵدەبژێرین



وێنەی ( ٤ )

پاشان جۆری شوێن و کات دیاری دەکەین کە ئەو هێمایانەی هەریکە جۆرە شوێنێکە




وێنەی ( ٥ )

پاشان جۆری ڕەنگ و مواصەفاتی سەیارەکە دیاری دەکەین بەهۆی کلیلەکانی  چەپ وڕاستی کی بۆردەکە.




وێنەی ( ٠٦ )

لەپاشاندا دەست بە یارییەکە دەکەی بەم جۆرەی کە بەخۆمانە ویست بوومان ، وە ئەم دووگمانە بناسە لەسەر کیبۆردەکە بۆ یاری کردن



وێنەی (٦)

تێبینی: ئەم یارییە لەسەر ئەم جۆرە سیستەمە کار دەکات

١. کارت شاشە 128
٢. ڕامی 256
٣. ویندۆزی 2000 , me ,xp
٤. پنتیۆم 4
٥. Dxdiag 9



وێنەی (٧)